# قونووت له نوێژداو

# کورته باسێک

دانانی
سید محمد سید اسماعیل سید عمر
پێشنوێژی مزگه‌وتی فرقان
هه‌ولێر



# قونووت له‌ نوێژداو

# کورته‌ باسێک

دانانی

سید محمد سید اسماعیل سید عمر

پێشنوێژی مزگه‌وتی فرقان

هه‌ولێر

**تێبینی:**

ماموستا سید محمد سید اسماعیل ئەم بابەتەی بە عەرەبی نووسیوە، عمر سید محمد کردوویەتە کوردی.

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير الأولين والآخرين وعلى آله وصحبه اجمعين، وبعد..

ماوەیەک بوو تێبینی ئەوەم دەکرد سەبارەت بە مەشروعیەتی قونووت لە نوێژی بەیانیاندا پرسینەوە هەیە؛ هەبوو حەزی دەکرد روون کردنەوەی زۆرتر لەم بارەیەوە ببیسێ وەک ئەوەی بڵێین لە وەڵامی سەرپێیی زیاتر بێ، ئارەزووی ئەوەشی دەکرد بەڵگەی دیاری بۆ دەستنیشان بکرێ. هەر لەم بوارە چەند برایەک داوایان لێ کردم شتێکیان بۆ بنووسم. جا هەرلە هەوڵی وەڵامی ئەو برایانە کەوتمە سەر ئەو فیکرەی ئەم بابەتە بکەمە نامیلکەیەک و مەشروعیەتی قونووت لە نوێژی بەیانیاندا روون بکەمەوەو ئەو بیرو رایانەی سەبارت بە قونووتەوە هەن بە پێی تواناو بە پێی گرنگییان بەدیاریان بخەم، دیان هەر لەگەڵ ئەم بابەتە قونووتی نوێژی کارەسات و

قونروتی نوێژی (وتر)یش که پەیوەندیدارن لەگەڵ یەک بخەمە

بەر هەوڵی روون کردنەوەیەکی خێرا. ئومێدیشمان سوودی

موسڵمانان و رەحم و رەزامەندی خودای پەروەردگارە.

## اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم

## بسم الله الرحمن الرحيم

﴿بـل لـه مـا في الســموات والأرض كــلٌ لـه قانتون﴾(البقرة:١١٦).

﴿حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقومـوا لله قانتين﴾(البقرة:٢٣٨).

﴿الصابرين والصادقين والقانتين والمنفقـين والمستغفرين بالأسحار﴾(آل عمران:١٧).

﴿يـا مريـم اقنـتي لربـك واسـجدي واركعـي مـع الراكعين﴾(آل عمران:٤٣)

- ﴿فالصالحات قانتات حافظات للغيب﴾(النساء:٣٣)

- ﴿ان ابراهيم كـان أمـةً قانتـاً لله حنيفاً ولم يـك مـن المشركين﴾(النحل:١٢٠).

- ﴿ومن يقنت منكنّ لله ورسوله وتعمل صالحاً نؤتها اجرها مرتين وأعتدنا لها رزقاً كريماً﴾(الأحزاب:٣١).

- ﴿إنّ المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات والصادقين والصادقات والصابرين والصابراتٰ والخاشعين والخاشعات والمتصدقين والمتصدقات والصائمين والصائمات والحافظين فروجهم والحافظات والذاكرين الله كثيراً والذاكرات أعدّ الله لهم مغفرةً وأجراً عظيماً﴾(الأحزاب:٣٤).

- ﴿امّنْ هو قانتٌ آناء الليل ساجداً وقائماً يحذر الآخرة ويرجو رحمة ربه﴾(الزمر:٩).

- ﴿عسى ربه إن طلقكنّ أن يبدله أزواجاً خيراً منكنّ مسلماتٍ مؤمناتٍ قانتاتٍ تائباتٍ عابداتٍ سائحاتٍ ثيباتٍ وأبكارا﴾(التحريم:٥).

﴿ومريم ابنت عمران التي أحصنت فرجها فنفخنا فيه من روحنا وصدّقت بكلمات ربها وكتبه وكانت من القانتين﴾(التحريم:١٢).

# وشەی (القنوت) یانی چی؟

بەر لـەوەی بچینـە نـاو بابەتەکـەوە بـە پێویـستی دەزانم چـەند دێڕێـک لـە دەرحـەقی مانایـە زمانەوانی‌یەکـەی وشـەی قونووت بنووسم؛ تا شێوازی بەکارهێنانە فەرهەنگی‌یەکەی وەدیار بکـەوێت و ببێتــە مایـەی زێـتر روون کردنـەوەی مەبەسـتی بابەتەکەی ئەم نامیلکەیە.

لە فەرهەنگی (لسان العرب)[1] لە ئەڵقەی پیتی (ق)دا، وشەی (القنوت) ناوزەد کراوە؛ وەک دەردەکـەوێ وشـەیەکی فـرە واتایە، بۆ چەند مانایەکی جودا جـودا بـەکار دێـت و هـەموویان لەگـەڵ ئـەو مانایانـەدا دەگونجێـن کـە لـە قورئـانی پـیرۆزو فـەرموودەکانی پێغەمبـەرﷺ و، قـەو نووسـینی زانایـە زمـان پاراوەکاند هاتوون؛ مانایەکانیش ئەمانەن:

خۆگرتن لە قسەو بێ دەنگ بوون، نوێژ کردن، دوعا کردن

---

[1] لسان العرب المحيط للعلامة ابن منظور.

له نوێژدا، مل کەچ کردن لە نوێژدا، دان پێدانان بە بەندایەتی بۆ خودا، تاعەت کردن و راوەستان و درێژەدان بە راوەستان.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿وقوموا لله قانتين﴾ لێرەدا وشەی (قانتين) کە کۆی (قانت)ەو (قانت)یش داڕێژراوێکی وشەی قونووتە بەمانای قسە نەکردن و بێ دەنگییە. (زيد كوڕی ارقم) دەفەرموێ: پێشتر، ئێمە لە نوێژدا قسەمان دەکرد، بەڵام هەر کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ئەوا لە نوێژدا بێ دەنگ بووین و قسەمان لەخۆ قەدەغە کرد.

لە پێغەمبەری خوداﷺ دەگێڕنەوە ((أنه قنت شهراً في صلاة الصبح بعد الركوع يدعو على رعلٍ وذكوان)) واتا یەک مانگ لە نوێژی بەیانیاندا لەدوای روکوعدا دوعای کردوە؛ دوعای لە هۆزی (رعل)و (ذكوان)[2] کردووە. وشەی (قنت) لێرەدا لەگەڵ وشەی (دوعای کرد) هاو واتایە.

(أبو عبيدة) دەفەرموێ بنچەی وشەی قونووت لە زۆر

---

[2] رعل و ذكوان، ناوی دوو هۆزن.

شتدایه، لەوانە: راوەستان، کە چەند فەرمودەیەکی پیرۆز لەم بارەیەوە هەمن واتا وشەی قونوتیان تیادا بەمانای راوەستان هاتووە چونکە نوێژکەر ئەو وەختەی دوعایەکە دەکات بە پێوەیەو لە حالەتی راوەستاندایە کە لە (اعتدال)ی دوای روکوعە.

(جابر) خودای لێ رازی بێ دەفەرموێ لە پێغەمبەریان پرسی: کامە نوێژ لە هەموو نوێژان خێری زیاترە؟ فەرمووی ئەو نوێژەی قونوتەکەی درێژ بێ کە لە فەرموودەکەدا بۆ ئەم مانایە (طول القنوت) هاتووە، (طول القنوت)یش بەمانای (طول القیام)ە واتا راوەستانی زۆرو درێژەدان بە راوەستان.

هەندێ جار بە مرۆڤی نوێژکەر دەگوترێ (قانت) وشەی (قانت)یش دارێژراوێکی وشەی قونوتە هەر وەکو لەم فەرموودەیەدا دیارە کە دەفەرموێ: ((مثل المجاهد في سبيل الله كمثل القانت الصائم)) واتا وێنەی ئەو کەسەی لە رێی خوادا غەزا دەکات و خەباتگێری رێگەی خودایە؛ وێنەی نوێژکەری رۆژووگرە.

فەرموودەیەکی دیکەی پێغەمبەرﷺ هەیە دەفەرموێ: ((تفکرُ ساعةٍ خیرٌ من قنوتِ لیلةٍ)) واتا یەک سەعات بیر کردنەوە لە زات و سیفەت و توانستی بێ پایانی خودا؛ خێری لە نوێژی یەک شەوی تەواو زیاترە، لێرەش وشەی قونووت بە مانای نوێژ هاتووە.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ ﴿كل له قانتون﴾ لێکدانەوەکەی لەوە دایە کە دەڵێ هەموویان لەبۆ ئەو (واتا لە بۆ زاتی خودا) گوێڕایەڵن و لە تاعەتدان، جا بەپێی ئەم داڕێژراوەش کە وشەی (قانتون)ە ئەوا لێرەدا قونووت بەمانای تاعەت کردن هاتووە[٢].

هەر لە مانایەکانی وشەی قونووتدا بە پێی زانینی زەمانەوانان ئەوا (الشیخ الحافظ زین الدین العراقي) پارچە شیعرێکی سەبارەت بە فرەمانایی وشەی قونووت ڕێکخستووە کە ئەمە دەقەکیەتی:

---

[٢] تا ئێرە لە (لسان العرب) وەرگیراوە.

ولفظ القنوت عدد معانيه تجد    مزيداً على عشر معان مرضيه
دعاء خشوع والعبادة طاعة    إقامتها إقراره بالعبوديه
سكوة صلاة والقيام وطوله    كذاك دوام الطاعة الرابح المقنيه

واتا، بێژەی قونووت مانایەکانی زیاتر لە دە مانای پەسەندن؛ دوعایە، مل کەچ بوون بۆ زاتی خودایە، خودا پەرستی‌یە، تاعەت کردنە، هەڵستان بە تاعەتە، دان پێدانانی بەندەیە بە بەندایەتی بۆ خودا، بێ دەنگ بوونە، راوەستانە، درێژە پێدانی راوەستانە هەر وەها بەردەوام بوونی سەر تاعەتە.

ئەمانە مانایە زمانەوانی‌یەکانی وشەی قونووتن کە هەر یەکە لە شوێنی تایبەتی و گونجاوی خۆیاندا لە رستەدا رێکن.

# وشەی (القنوت) وەکو زاراوە

هەرچی ماناى زاراوەیی وشەی (القنوت)ە ئەوا بەپێی زانستی شەرع لەنێو ئەم پێناسەیەدا بەدیاری دیارە کە دەڵێ: قونووت چەند ویردێکی تایبەتییەو لە شوێنێکی تایبەتیداو بریتییە لە هەندێ دوعاو زیکری خودا.

مەبەست لەم پێناسەیە ئەوەیە وەختێ نوێژکەر لە روکوعەدا قیت دەبێتەوە هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوەو دوعایەک هەیە (لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دەینووسین) دەیخوێنێ، کە تەواو بوو ئەوسا دەچێتە سەجدە. جا مانایە شەرعییەکەی، کە لێرەدا مەبەستە، لەگەڵ هەموو مانایە زمانەوانییەکاندا دەگونجێ بەڵام لە هەندێکیاندا دیارتر دیارە وەک لە هەندێکی دیکەیاندا بە تایبەتی لەو مانایەی دوعا کردن دەگرێتەوە.

سەبارەت بە شوێنی قونووت خوێندنیش هەر وەکو

گوتمان لەدوای روکوع دایە بەڵام ئیمامی (أبو حنیفة)و چەند زانای دیکە لەو بڕوایەدان کە لەپێش روکوعدا دەبێت ئەویش لە نوێژی (وتر)دا هەر وەک لە لاپەڕەکانی داهاتوودا روونیان دەکەینەوە.

# قونووتی نوێژی بەیانیان و دووبیرورِا

مرۆڤی زاناو زانست پەروەر لەنێو یارانی پێغەمبەردا ﷺ و لەنێو زانایانی سەردەمی دوای ئەوان و، شەرعزانە پێشینەکان و زانایانی دوای ئەوانیش؛ هەمووبان سەبارەت بە مەشروعیەتی قونووت لە نوێژی بەیانیاندا بوونەتە دوو تاقم و دوو بیرورِا ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا﴾[1]. هەر تاقمێکیش لەم دووانە بەڵگە لەنێو فەرموودەو رەفتارەکانی پێغەمبەر ﷺ داو، بەڵگە لەنێو رەفتاری یاوەران و زانایە پێشینەکان دەکاتە کۆڵەگەی راستیی بیر بۆچوونی خۆی.

پەنا بەخوا سەرەتا ئەو فەرموودە پیرۆزانە دەنووسین خاوەنی هەردوو بیر کە، بیرورِای خۆیان لێ هەڵێنجاوە

[1] سورەتی البقرة ۱٤۸.

کردوویانەتە سەرچاوەی حوکم لێدان و بەڵگەی بۆچوونی خۆیان.
لە پاشدا هەڵبژاردە لەنێو ئەم دوو بیرو رایە دەخەینە روو کە هەڵبژاردەی لایەن زانای لێتوژەرن، ئەویش بە پێی تێگەیشتن و دەرک پێ کردنی خۆیان؛ هەڵبژاردنەکەیان لەو فەرموودانەدا کردووە، ئینجا هەر لەنێو فەرموودەی یاوەراندار لەنێو فەرموودەی ئەو زاتانەی؛ پێغەمبەری مەزنﷺ لەنێو هەموو یاوەراندا پەنجەی ستایشی بۆ ئاماژە کردوون؛ بەڵگەی دیکە دەهێنینەوە کە دەبنە سەلمێنەری بیرو رای ئێمە لەسەر مەشروعیيەتی قونووتی نوێژی بەیانیان.

# بیرو رای یەکەم

خاوەنی ئەم بیرو رایە دەڵێن قونووت لە نوێژی بەیانیاندا سوننەتە، ئەگەر نوێژکەر بیخوێنێ ئەوا لە لایەن خوداوە پاداشتێکی زۆری لێ دێتە بەرهەم، بەڵگەش بۆ بیرو رایەکەیان لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەرەوە دەخوازن، کە ئەم فەرموودانەی خوارەوە فەرموودەی دیاری ئەم بابەتەن:

**عن أنس ﷺ انه قال: ما زال رسول الله ﷺ يقنت في صلاة الصبح حتى فارق الدنيا. رواه الدارقطني والحاكم وعبدالرزاق**[*].

لە ئەنەس خودای لێ رازی بێ دەگێرنەوە فەرموویە کە پێغەمبەری خودا ﷺ هەتا ئەو کاتەی ماڵاوایی لە دونیا کرد دوعای قونووتی لە نوێژی بەیانیاندا هەر دەخوێند.

**عن أنس ﷺ ان النبي ﷺ قنت شهراً يدعو عليهم ثم**

[*] التاج الجامع للاصول في أحاديث الرسول ج١.

ترك، فاما في الصبح فلم يزل يقنت حتى فارق الدنيا. حديث صحيح[6].

واته له نهنهس خوداى ليّ رازى بىّ دهگێرنهوه كه پێغهمبهر ﷺ يهك مانگ قونووتى كردووهو دوعاى ليّ كردوون[7]، پاشان وازى هێنا بهلام له نوێژى بهيانياندا ههتا كۆچى دوايى كرد ئهوا دوعاى قونووتى ههر دهخوێند. فهرمووده‌كه له جۆرى (صحيح)ه كۆمهڵێك له زانايانى فهرمووده‌ى پێغهمبهر به (صحيح)يان داناوه، ئهوانه (ابو عبدالله)و (الحاكم)و (البيهقي)و ههروه‌ها (الدارقطني)ش ريوايهتى كردووه.

روى البيهقي عن عمر ﷺ من طرُقٍ وعن عبدالله بن معقل التابعي قال: قنت علي ﷺ في الفجر. رواه البيهقي وقال هذا عن علي صحيح[8].

(البيهقي) له نيهامى عومهر خوا ليّى رازى بىّ به چهند

---

[6] المجموع شرح المهذب للإمام النووي ج٣ ل٤٩٢.

[7] دوعاى له هوزه‌كان كردووه.

[8] المجموع ج٣.

ڕێیان دەیگێڕێتەوە، هەروەها لە (عبداللە ی کوڕی معقل)یش دەگێڕێتەوە کە فەرموویە ئیمامی (علی) قونووتی نوێژی بەیانیانی کردووە. ئەم فەرموودەیە لە ڕیوایەتی (البیهقی)یەوە دەڵێ ئەم قسەیە ڕاستەو ئیمامی (علی) وای کردووە.

٤) عن العوام بن حمزة قال سألت أبا عثمان عن القنوت في الصبح قال بعد الركوع، قلت عمّن قال عن أبي بكر وعمر وعثمان وعلي ﷺ. رواه البيهقي حديث حسن[٩].

ئە (العوام کوڕی حمزە) دەگێڕنەوە فەرموویە، سەبارەت بە قونووتی نوێژی بەیانیان پرسیارم لە (أبا عثمان) کرد فەرمووی لەدوای ڕوکوعە گوتم لە کێیەوە؟ گوتی لە (ابوبکر)و (عمر)و (عثمان)و (علی) خودایان لێ ڕازی بێ.

٥) عن البراء أن رسول الله ﷺ كان يقنت في الصبح والمغرب. رواه الخمسة. وفي رواية عن البراء أنّ النبي ﷺ

---

[٩] هەمان سەرچاوە.

يقنت في صلاة الصبح. رواه أبو داود[10].

له (البراء) دەگێڕنەوە فەرموویە کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیان و نوێژی مەغریبدا قونووتی دەخوێند، هەر لە (البراء)ەوە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا لێی دەگێڕنەوە فەرموویە پێغەمبەر لە نوێژی بەیانیاندا قونووتی دەخوێند.

٦) أخبرنا اسماعيل بن مسعود قال حدثنا بشر بن المفضل عن محمد بن سيرين قال حدثني بعض من صلى مع رسول الله ﷺ صلاة الصبح فلما قال سمع الله لمن حمده في الركعة الثانية قام هنية. رواه النسائي وابو داود[11].

(اسماعيل کوڕی مسعود) بۆی گێڕاینەوە گوتی (بشر کوڕی المفضل) لە (محمد کوڕی سیرین)ی بیستووە گوتوویەتی هەندێ لەوانەی نوێژی بەیانیانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا کردووە قسەیان بۆ کردووم و گوتیان وەختێ پێغەمبەر لە ڕکاتی دووەم

---

[10] هەمان سەرچاوە.

[11] هەمان سەرچاوە.

گوتی (سمع الله لمن حمده) تێزێنك راوەستا.

٧) حدثنا حماد بن زيد عن أيوب عن محمد قال سُئل أنس أقَنتَ النبيﷺ في الصبح؟ قال نعم، فقيل أوقنتَ قبل الركوع؟ قال قنت بعد الركوع يسيرا. رواه البخاري[١٢].

(حماد كوڕی زید) قسەی بۆ كردین كە لە (أيوب)ی بیستوە ئەویش لە (محمد)ی بیستوە كە گوتوویە لە ئەنەسیان پرسی ئایا پێغەمبەر قونووتی كردووە؟ فەرمووی بەڵێ. پێیان گوتووە لە پێش روكووع؟ فەرموویەتی لەدوای روكووع بە كەمێك.

٨) حدثنا أبو الوليد قال حدثنا شعبة عن ثابت قال كان انس –ولأبي ذر كان انس بن مالك– ﷺ ينعت لنا صلاة النبيﷺ فكان يصلي فاذا رفع راسه قام حتى نقول قد نسي– اي وجوب الهوى– او انه في صلاة او ظنّ أنه وقت

---

[١٢] التاج ج١.

القنوت[١٣].

(ابو الوليد) قسەی بۆ كردین كە لە (شعبەی كوڕی ثابت)ی بیستوە گوتوویە، ئەنەس كوڕی مالیك -خودا لێی ڕازی بێ- باسی نوێژی پێغەمبەرﷺی بۆ كردین: دەڵێ وەختێك نوێژی دەكرد هەر كە سەری بەرز كردەوە ڕاوەستا بە شێوەیەك دەمانگوت: یا لەبیری كردووە لەناو نوێژدایە یا گومانی لە داهاتنی وەختی قونووت هەیە.

٩) حدثنا نصر بن علي الجهضمي حدثنا سهل بن يوسف حدثنا حميد عن انس بن مالك قال سُئل عن القنوت في صلاة الصبح فقال كنا نقنت قبل الركوع وبعده. رواه إبن ماجه[١٤].

(نصر كوڕی علی الجهضمي) لە (سهل كوڕی يوسف)و ئەویش لە (حميد)ی بیستوە كە لە ئەنەس كوڕی مالیك دەگێڕنەوە كە دەربارەی قونووتی نوێژی بەیانیان پرسیاری لێ

---

[١٣] ریوایەتی البخاري.

[١٤] ارشاد الساري لشرح صحيح البخاري ج٢.

كراوه فەرموويە لەپێش ڕوكووع و لەدواى ڕوكووع قونووتمان دەكرد.

هەروەها (القسطلاني) لە ڕاڤەى (البخارى) دەڵێ ئەمە ڕاستە كە (أبو هريرة) لە سەردەمى ژيانى پێغەمبەرﷺو لەدواى وەفات كردنى پێغەمبەر قونووتى نوێژى بەميانيانى كردووە.

لە كاتێكيشدا تێبينى ئەوە دەكرێت كە (أبو هريرة) خۆى ئەو ڕاستى‌يەى دەربڕيوەو گوتوويە كە ئەو لە هەموو كەس زياتر شارەزاى نوێژكردنى پێغەمبەرەﷺ. جا ئەم كردارەى لە نوێژو ئەم گوتنەى؛ بەڵگەى مەشروعيەتى قونووتى نوێژى بەميانيانن.

١٠) وللبيهقي عن ابن عباس رضي الله تعالى عنهما كان رسول اللهﷺ يعلمنا دعاءً ندعو به في القنوت من صلاة الصبح.

(البيهقى) لە (ابن عباس)ى دەگێڕێتەوە (خوداى لێ ڕازى بێ) فەرموويە پێغەمبەرﷺ دوعايەكى فێر كردين لە

قونووتی نوێژی بەیانیاندا دوعای پێ بکەین.

ئەوانەی رابرد، ئەو فەرموودانە بوون بوونەتە بەڵگەی ئەوانەی دان بە مەشروعیەتی قونووتدا دەهێنن لە نوێژی بەیانیاندا، جگە لەم فەرموودانەش فەرموودەی دیکە هەن بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ مەشروعی‌یەتی قونووتی بەیانیانیان لێ دەفامرێتەوە بەڵام ئەوەندەی ئەوانە بەڵگەدار نین چونکە ئەو فەرموودانەی سەرەوە بە ئاشکرایی مەشروعی‌یەتی قونووت دەسەلمێنن، بۆیە هەر ئەوەندەمان بە پێویست زانی ریزیان بکەین.

سەرباری ئەم بەڵگانە، دەڵێین ئەو زاتانەی گوتوویانە قونووت لە نوێژی بەیانیدا سوننەتە بخوێندرێ ئەوا زۆرن، لەوانە:

هەر چوار خەلیفەکانی راشیدین (أبو بكر الصديق و عمر الفاروق و عثمان ذو النورين و علي المرتضى) خودایان لێ رازی بێ، بێجگە لەو زاتانە زۆری دیکە لە یاوەرانی

پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەر ئەو بیرو رایەن، وەکو[١٥]:

(عمار کوڕی یاسر)و (أبي کوڕی کعب)و (أبو موسی الأشعري)و (عبدالرحمن کوڕی ابي بکر الصدیق)و (عبدالله ی کوڕی عباس) لە ریوایەتێکداو (أبو هریرة)و (البراء کوڕی عازب)و (أنس کوڕی مالك)و (ابو حلیمة کوڕی معلا کوڕی الحارث الأنصاري)و (خفاف کوڕی ایماء کوڕی غفلة)و (ابو عثمان النهدي)و (ابو رافع الصائغ). لە تابیعەکانیش وەکو (سعید کوڕی المسیب)و (الحسن کوڕی الحسن)و (محمد کوڕی سیرین)و (ابان کوڕی عثمان)و (قتادة)و (طاوس)و (عبید کوڕی عمین)و (الربیع کوڕی خیثم)و (أیوب السختیاني)و (عبیدة السلماني)و (عروة کوڕی الزبیر)و (زیاد کوڕی عثمان)و (عبدالرحمن کوڕی ابي لیلی)و (عمر کوڕی عبدالعزیز)و (حمید الطویل).

هەروەها لەنێو پێشەوایان و زانایانی شەرعدا گەلێکیان

---

[١٥] جامع الترمذي مع شرحه تحفة الأحوذي ج٢.

دانیان به مەشروعی‌یەتی قونووتی بەیانیاندا هێناوە، لەوانە:

(ابو اسحاق)و (ابو بکر کوڕی محمد)و (الحکم کوڕی عتیبة)و (حماد)و (مالك کوڕی أنس)و جگە لەوانەش (الأوزاعي)و (الشافعي)و یاوەرەکانی‌و (الثوري) لە دوو ریوایەتاندا، هەروەها خەڵکی حیجازو زۆربەی خەڵکی شامیش. بێجگە لەو هەمووانەی ناومان بردن خەڵکی دیکەی زۆرتریش هەن لایەنگری بیروڕای ئەو تاقمەن: سەرچاوەی ئەمەش ئەوانەن ئەو فەرموودانەیان راڤە کردووەو مانایەکانیان لێک داوەتەوە بۆ نموونە وەک (تحفة الأحوذي)؛ بەرگی سێیەم.

# بیروڕای دووەم

هەرچی خاوەنی ئەم بیرو ڕایەن، ئەوا قونــووت لــە نوێــژی بەیانیاندا بە ســونــەت دانانێن؛ بۆ سەلماندنی ئەم بیرو ڕایەشــیان چەند فەرموودەیەک دەکەنە بەڵگە، وەکو ئەوانەی دێ:

١) عن أنس ﷺ أن النبي ﷺ قَنَتَ شــهراً بعد الركوع يدعو على أحيــاءٍ مــن العــرب ثــم تركــه. رواه البخــاري ومسلم[١٦].

لــە ئەنــەس دەگێڕنــەوە کــە پێغەمبــەر ﷺ یــەک مــانگ لــەدوای ڕوکوعــدا قونووتــی کــردوومو دوعــای لــە هــەندێ هــۆزی عەرەبان کردووە پاشان وازی هێنا.

٢) حديث أبــي هريــرة ﷺ أن النــبي ﷺ قــنــت بعــد الركوع في صلاة الصبح شــهراً يدعو لفــلان وفــلان ثم تــرك

---

[١٦] المجموع ج٣.

الدعاء عليهم. رواه البخاري ومسلم[17].

(ابو هريرة) خوداى لىَ رازى بىَ دەفەرمووىَ: پيَغەمبەرﷺ يەك مانگ لە نويَژى بەيانيدا قونووتى دەكردو دوعاى لە فيلان كەس و فيلانە كەس دەكرد، پاشان وازى لە دوعاكردن هيَنا ليَيان.

٣) حديث سعد بن طارقﷺ قلت لأبي، يا أبي صلّيت خلف رسول اﷲﷺ وأبي بكر وعمر وعثمان وعلي فكانوا يقنتون في الفجر فقال أي بنيّ فحدثٌ وفي رواية أي بنيّ محدث. رواه النسائي والترمذي، حديث حسن صحيح[18].

ئەم فەرموودەيە (سعد كوڕى طارق) دەيگيَڕيَتەوە دەلّىَ: گوتمە باوكى خۆم: بابە تۆ لە دواى پيَغەمبەرﷺ نويَژ كردووەو لەدواى ئيمامى (أبوبكرو عمرو عثمان و علي)ت نويَژ كردووە، ئەوانە لە نويَژى بەيانياندا قونووتيان دەكرد؟ گوتى

---

[17] هەمان سەرچاوە.

[18] الترمذي ج١.

کورِم ئەمە تازە داهاتووەو، واتا ئەیان کردووە.

٤) حديث ابن مسعود ﷺ قال ما قنت رسول الله ﷺ في شيء من صلاته[١٩].

(ابن مسعود) خودای لێ رازی بێ دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ لە هیچ نوێژێکی خۆیدا قونووتی نەکردووە.

٥) حديث أبي مخلّد قال صلّيت مع ابن عمر (رضي الله تعالى عنهما) قال ما قنتَ رسول الله ﷺ في الصبح فلم يقنتْ فقلتُ له ألا أراك تقنتُ فقال ما احفظه -أي القنوت- عن احدٍ من اصحابنا[٢٠].

(ابی مخلد) دەفەرموێ نوێژی بەیانیم لەگەڵ (ابن عمر) کرد، خوایان لێ رازی بێ، فەرمووی پێغەمبەر ﷺ قونووتی بەیانیانی نەکردووە، ئەویش قونووتی نەکرد، پێم گوت ناتبینم قونووتی بکەی؟ فەرمووی نایەتە بیرم یاوەرێک لە یاوەرانی

---

[١٩] المجموع ج٣.

[٢٠] هەمان سەرچاوە.

پێغەمبەر کردبێتی.

٦) حديث ابن عباس (رضي الله تعالى عنهما) قال: القنوتُ في الصبح بدعةٌ[٢١].

(إبن عباس) دەفەرموێ قونووت لە نوێژی بەیانیاندا بیدعەیەو تازە بابەتە.

٧) حديث أم سلمة: عن النبيﷺ أنّه نهى النبي عن القنوتِ في الصبح. رواه البيهقي[٢٢].

(أم سلمة) لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە کە نەیهێشتووە قونووت لە نوێژی بەیانیاندا بکرێت.

ئەمانە ئەو فەرموودانە بوون کە ئەوانەی مەشروعیەتی قونووتی بەیانیان ڕەت دەکەنەوە کردوویانەتە بەڵگەی ڕاستیی بیروڕای خۆیان کە بە پێی بۆچوونی ئەوان ئەم فەرموودانە نیشانەن لەسەر ئەوەی قونووتی نوێژی بەیانیان سوننەت نەبێ. لە فەرموودەکەی (أنس)و فەرموودەی (أبو هريرة) وا دەگەیەنێ

---

[٢١] هەمان سەرچاوە.

[٢٢] هەمان سەرچاوە.

که قونووت به هەمیشەیی و بە بەردەوامی سوننەت نەبێ بەڵکو بۆ ماوەیەکی کاتی دیار بێ. فەرموودەکەی (سعد کوڕی طارق) ئاماژە بەوە دەکات کە قونووت تازە بابەتەو لەدوای خۆشەویستەوە ﷺ داهاتبێ. فەرموودەکەی (ابن مسعود)یش ئەوە نیشان دەدات کە پێغەمبەر ﷺ لە هیچ وەختێکی نوێژدا قونووتی نەکردووە، واتا بە پێی ئەم قسانەی (ابن مسعود) لە ج کاتێکی نوێژدا سوننەت نیەو بەیانیانیش هەروەها بە فەرموودەی (أبي مجلد)یش (ابن عمر) نەهاتۆتە بیری لەوەی یاوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ دیبێ قونووتیان کردبێ کە بە پێی تێگەیینی ئەو مەشروع نەبووبێ. لە فەرموودەی (ابن عباس) وا پێ دەچێ کە ئەو بەوە تێگەییوە قونووت تازە بابەتەو شەرعی نەبووە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەی نکوڵی لە مەشروع بوونی قونووتی نوێژی بەیانیان دەکەن ئەوا بە پێی زانین و رادەی بۆچوونیان لە مانای ئەو فەرموودانەی سەرەوە بۆ سەلماندنی ئەو بیرو بۆچوونەیان بەڵگەیان لێ دەخوازن و دەڵێن قونووت لە نوێژی بەیانیاندا مەشروع نیە.

جا ئەوانە فەرموودەكان بوون، هەرچی ئەو زاتانەی لەسەر ئەم رایە دان ئەوا ئەوانیش زۆرن بەلام ژمارەیان ناگاتە ژمارەی ئەوانەی خاوەنی بیروڕای یەكەمن. جا لەوانەی دەستەی دووەم ناوی هەندێكیان دەهێنین وەكو:

(عبدا لله ی كوڕی مسعود)و هاوڕێیەكانی، (أبو هريرة) لەیەك ریوایەتدا، ئیمامی (أبو حنيفة)و یاوەرەكانی، (سفيان الثوري) لەیەك ریوایەتداو ئیمامی (أحمد كوڕی حنبل)و هەندێكی دیكە، كە بە كورتی هەر وەكو گوتمان ئەوانە دەڵێن بە پێی فەرموودەكان قونووت لە نوێژی بەیانیاندا مەشروع نیە.

سەبارەت بەم بۆچوونەی ئەم تاقمە؛ ئەوانەی خاوەنی بیروڕای یەكەمن واتا كە دەڵێن مەشروعە وەلامی ئەوانەیان بەچەند شێوەیەك داوەتەوە وەكو ئەوەی لە وەلامی هەردوو فەرموودەی یەكەم و دووەم كە فەرموودەی (أنس)و فەرموودەی (أبو هريرة)ن خودایان لێ رازی بێ كە بوونەتە بەڵگەیان بۆ دروست نەبوونی قونووتی بەیانیان: لەو قسەیەی دەڵێ ((ثم تركه)) واتا وەكو دەڵێن، لە پاشدا وازی لێ هێنا ئەوا وەلامیان

بەوە داوەتەوە کە پێغەمبەر وازی لە دوعا لێکردن و بە نەفرەت کردنی گاورەکان هێناوە ئەوەش لە تێکڕای قونووتەکەو نابێتە مایەی مەشروع نەبوونی قونووت لە نوێژی بەیانیدا، یاخود وەکو دەڵێن ئەم واز لێ هێنانە بۆ نوێژەکانی دیکەی بێجگە لە نوێژی بەیانی بووە، فەرموودەی دی مەشروع بوونی قونووت دەگەیەنن، هەر فەرموودەکەی (أبو هريرة) ئاشکرا بێژی ئەم لە دوعا وازهێنانەیە کە دەفەرموێ ((ثم ترك الدعاء عليهم)) واتا پاشان وازی لە دوعا لێکردنیان هێنا.

گەرەکە ئەوە دیارو ئاشکرا بێ کە دەبێ ئەم لێکدانەوەیە پێویست بێ چونکە لێ لادانی لێ ناوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی فەرموودەکەی (أنس) کە دەڵێ: ((لم يزل يقنت في الصبح حتى فارق الدنيا)) فەرموودەیەکی (صحيح)ەو مانایەکەی ئاشکرایەو، بەڕوونی مەشروعیەتی قونووتی نوێژی بەیان ئاشکرا دەکاو چ تەم و مژێکی بەسەرەوە نیە.

پێوستە هەر فەرموودەیەکی لە مانایەکدا پێچەوانەی ئەم مانایە ئاشکرایەی ئەم فەرموودەیە بێ وا لێک بدرێتەوە

لەگەڵیدا گونجاو بێت چونکە ئەمــە دیـارەو، واجبیشــە کـە دوو فەرموودەی (صحیح) نابێ لە ماناداد لەگەڵ یـەکدی نـاکۆک بـن جا ئەگەر لە ڕووی دیاری دەرەوەدا مانایەکـمیان هـاوڕێک نـەبوو ئەوا دەبێ لێکدانەوەیەکی ئەوتۆی بۆ بکرێ لەگەڵ ئاشـکرا بێـژی ئەم فەرموودەیەدا بسازێت.

فەرموودەکانی (أنـس) خـودای لـێ ڕازی بـێ هـەموویان (صحیح)ن جا ئەگەر دژایەتی یەک لـە نێوانیـاندا روو بـدا، ئـەوا دەبێ بخرێنەوە پاڵ یەک و بـە شـێوەیەکی راسـت و دروسـت کـۆ بکرێنەوە جا بەم کردارە پـیرۆزە چ چەشـنە دژایەتی یـەک نایەتـە ئاراوە. لـە موسـڵمانی خـاوەن بـیرو بـڕوای پتـەو ئومێدەوارین، وەختی لە مانا نۆڕیندا پشت بەم لێکدانەوەیـە ببەسـتیو خۆ بـە هیـچ جۆرە لاڕێیـەکدا نـەتارێنێ تـا تووشـی ڕاڕایـیو دوو دڵـی نەبێت.

هەر ئـەم فەرموودەیـەی سـەرەوە، فەرموودەیـەکی دیکـە داکۆکـی لـە مانایەکـەی دەکـات ئـەویش ئـەو فەرموودەیـە کـە (البیهقي) ریوایەتی دەکات لە (عبدالرحمن کوڕی مهدي الإمام)

دەیگێڕێتەوە کە فەرموویە (انما ترك اللعن .... الخ) بە ئاشکرا ئەوە دیار دەکات کە پێغەمبەر هەر بە نەفرەت کردنەکەی واز هێناوە. وەڵامی فەرموودەی سێیەم کە فەرموودەکەی (سعد کوڕی طارق)ە، ئەوەیە کە ئەوانەی ئەو فەرموودانەیان ریوایەت کردووە کە قونووتی نوێژی بەیانیان دەسەلمێنن ئەوا زاناترن و بە ژمارەش زۆرترن، پێویستە قسەی ئەوان پێشتر بخرێ کە دیاریشە راستی لەلای ئەوانەیە زۆرترن و زیاتریش ئاگاداری فەرموودەو کرداری پێغەمبەر بوونە بە تایبەتی ئەوانەی زۆرترینی وەخت هاودەم و ئاوەڵی پێغەمبەرﷺ بوونەو هاورێیەتییان لەگەڵدا بەردەوامتر بووە.

وەڵامی فەرموودەی چوارەم واتا فەرموودەکەی (ابن مسعود) ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە لە جۆری (ضعیف)ەو بێ هێزە، ئەویش لەسەر ئەو قسەیەی دەڵێن ریوایەتی (محمد کوڕی جابر السحمي)یەو ریوایەتی ئەو بێ هێزەو کاری پێ ناکرێ، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودەیە نەفی دەکات واتا دەڵێ نەبووە، هەر وەکو دیارە فەرموودەی (أنس)یش دەیسەلمێنێ و

دەڵێ هەبووە، ئەمەش لەلایەن زانایانی زانستی بنچەکانی شەرع دیارە کە (إثبات) لەپێش (نفي) دایە چونکە ئەو هێزەی لە (إثبات)دا هەیە لە (نفي)دا نیە هەر وەک بە سەرزەندەی عەقڵیش هەر دەبێ (إثبات) لەپێشتر بێ.

وەڵامی فەرموودەی پێنجەم، فەرموودەکەی (ابن عمر)ە کە دەڵێ ((انه لم يحفظ..... )) واتا نەهاتۆتە بیری، یان لەبیری کردووە، لە کاتێکدا (انس)و (البراء کوڕی عازب)و هی دیکەی جگە لەوان لەبەریان بووە، پێویستیشە کێ لەبەری بوو لەبیری بێ بڕیاری ئەو بەپێش ئەو کەسە بخرێ کە لەبەری نیەو لەبیری نیە. هەروەک ئەو پەندەی دەڵێ ((قُدِّم من حُفِظ على مَنْ لم يحفظ)) واتا کێ لەبەری کردبێ بەپێش ئەو کەسە دەخرێ کە لەبەری نەکردبێ.

وەڵامی فەرموودەی شەشەم، فەرموودەی (ابن عباس)ە فەرموودەیەکی بێ هێزە، لە (ابي ليلى الكوفي) ریوایەتی کردووە، ریوایەتی (أبي ليلى)ش ئەوەندە گوێی پێ نادرێتیو کاری پێ ناکرێ سەرەڕای ئەوەی هەر لە (ابن عباس) خۆیەوە

ریوایەتێکمان ناو برد کە فەرموویە (قنت رسول الله ﷺ في الصبح) لە پێشتریش گوتمان سەلمێنراو بە پێش نەفی دەکەوێ جا چ ریوایەتی خۆی بێ یا هی دیکە بێ.

وەلامی فەرموودەی حەفتەم فەرموودەی (أم سلمة)یە لەسەر قسەی هەندێ کەس (ضعیف)ە، لەبەر ئەوەی دەڵێن لە ریوایەتی (محمد کوڕی یعلی)یەو لە (عتبة کوڕی عبدالرحمن کوڕی عبدالله نافع)ە کە ئەویش لە باوکی خۆی ریوایەتی کردووە، باوکیشی لە (أم سلمة)ی ریوایەت کردووە (الدارقطني) دەڵێ ریوایەتی ئەم سێ کەسە بێ هێزەو پێ ناچێ ئەوە راست بێ کە نافع گوێی لە (أم سلمة) بووبێ. -هەر خوداس چاکتر دەزانێ چۆنە-.

ئەمە پوختەی قسەی هۆزانی پایە بەرز شێخی (نووي) بوو کە لە راقە کردنی (المهذب)دا نووسیویەتیو پوختەی بۆچوونی راقەکاری فەرموودەکانی نێو (عون المعبود)و راقەی (سُنن أبي داود)و (تحفة الأحوذي) لە راقەی (الترمذي)و (القسطلاني) لە راقەی (البخاري) دان.

ئێمەش بە پێی هەڵێنجانی قسەو لێکۆڵینەوەی لێتوژەرەکان و بەپێی هەندێ ڕێسای باوی نێو زانستی شەرع ئەوا دەڵێین ئەوەی بیروڕای یەکەم (واتا دروست بوونی قونووتی بەیانیان) لاسەنگ و ڕاستتر دەکات هەندێ بۆچوونی دیکەیە بێجگە لەوانەی باس کرا، وەکو ئەوەی دەڵێین لەنێو ئەوانەی لەسەر ئەو بیروڕایەن چوار خەلیفەکانی ڕاشیدین (خودایان لێ ڕازی بێ) کە ئەو زاتانەش زیاتر جێی پابەندیان لە لایەن پێغەمبەرﷺ دیارتر بووە، هەروەک لە فەرموودەیەکی (صحيح)دا هاتووە کە دەفەرمووێ ((فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين)) واتا پێویستە لەسەرتان دەست بە سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە ڕاشیدیە هیدایەت پێ دراوەکانەوە بگرن. ئەم فەرموودەیەش (ابو داودو الترمذي) ڕیوایەتیان کردووە، (الترمذي) دەڵێ ئەم فەرموودەیە لە جۆری (حسن)ە، لە دانەیەکی دیکەدا دەڵێ (حسن صحيح). سەرەڕای ڕیوایەتی ئەم دووانە ئیمام (أحمد)و (ابن ماجه)و (أبو نعيم)یش ڕیوایەتیان کردووە، (ابو نعيم) دەڵێ فەرموودەیەکی

چاکە. جا بێجگە لەم فەرموودەیەش پێغەمبەری مەزنﷺ لە فەرموودەیەکی دیکەی (صحیح)دا کە (حذیفة) ریوایەتی کردووە دەفەرموێ ((اقتدوا باللذین بعدي، فأشار الیهما أي الی أبي بکرالصدیق وعمر الفاروق)) واتا پەیڕەوگری ئەم دوو کەسە بن کە لەدوای منەوە دێن، ئاماژەشی بۆ هەردووکیان دەکرد واتا بۆ حەزرەتی (أبوبکر)و حەزرەتی (عمر).

جا گەرەکە مرۆڤی موسڵمان زەینی خۆی بداتە ئەم دوو دەقە پیرۆزە بزانێ خواستی چی دەکەن و چییان لێ دەفامرێتەوە؟ دەڵێین ئەوەیان لێ دەرەنجام دەکرێ کە گوێڕایەڵ بوونی فەرمانی پێغەمبەر پێویستە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کار بە کردارو رەفتاری ئەوان بکرێت و پەیڕەو بکرێن جا ئەمەیە نیشانەی لاسەنگ بوونی رای ئەوانەی دان بە مەشروع بوونی قونووتدا دەنێن، زیاد لەمەش رای زۆربەی یاوەرانی دیکەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵدایە کە ئەوان قونووتیان دەکردو لە قونووتدا دوعای پێغەمبەرﷺیان دەخوێند یان ئەو دوعایەی

ئیمامی (عمر)یان دەخوێند. لەمێو ئەو یاوەرانەشدا وەکو[٢٣] (عمار کوڕی یاسر)و (أبي کوڕی کعب)و (أبو موسی الأشعري)و (عبدالرحمن کوڕی ابوبکر)و (عبدا لله ی کوڕی عباس) لە ریوایەتێکداو (أبو هريرة) لەوەی خۆی لە بەیانیاندا قونووتی کردووەو (البراء کوڕی عازب)و (أنس کوڕی مالك)و (أبو حليمة معاذ کوڕی الحارث الأنصاري)و (احفاف کوڕی ایماء کوڕی رخصة)و (اهبان کوڕی صيفي)و (سهل کوڕی سعدالساعدي البدري)و (عرفجة کوڕی شريح الأشجعي البدري)و (معاوية کوڕی ابي سفيان)و (عائشة الصديقة). هەروەها لەمێو (المخضرمين)یشدا (أبو رجاء العطاردي)و (سويد کوڕی غفلة)و (ابو عثمان الشهدي)و (ابو رافع الصائغ البدري). لەمێو تابیعانیشدا واتا ئەوانەی دوای سەردەمی پێغەمبەرﷺ زۆرن: ئەوانەی دەڵێن قونووتی بەیانیان مەشروعە؛ لەوانە (سعيد کوڕی المسيب)و (الحسن کوڕی عثمان)و

[٢٣] جامع الترمذي مع شرحه تحفة الأحوذي ج١.

(قتادة)و (طاوس)و (عبيد كوڕى عمير)و (الربيع كوڕى خيثم)و (أيوب الزبير)و (زياد كوڕى عثمان)و (عبدالرحمن كوڕى ابي ليلى)و (عمر كوڕى عبدالعزيز)و (حميد الطويل).
ديسان سەرەڕاى ئەوانە زۆربەى زانايانى شەرعيش هەر لەسەر ئەو ڕايەن كە قونووتى نوێژى بەيانيان دروستە، لەوانە ئيمامى شافيعىو هاوڕێيەكانى، (ابو اسحاق)و (ابوبكر كوڕى محمد)و (الحكم كوڕى عتيبە)و (حماد)و (مالك كوڕى انس)و (الاوزاعي)و (الثوري) لە دوو ريوايەتاندا هەروەها خەڵكى حيجازو زۆربەى خەڵكى شام و زۆرى ديكەش. جا كۆمەڵێكى لەو تەرزە، ئەوا خاوەنى شارەزايى تەواو و زانستى زۆرن سەبارەت بە حوكمەكانى ئاينى ئيسلام و پێداويستەكانى نوێژو تاعەت. هەمووشيان لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ وەرگرتووەو لەبۆ جێماوە. جا وەختێ هێزى بەڵگەى ئەوانەمان دەرخست كە هێزى بەڵگەيان بە ئاشكراييەكى فرە ئاشكرا ديارە كە دان بە مەشروعيەتى قونووتى بەيانيان دەهێنن: ئەوە سەلمێندرا لەگەڵ ئەوەى زێدە زاناو ناودارن، متمانەيان پێ دەكرێت وبڕوايان

لەسەر ئەوا:

ئێمەش بیروڕای ئەوانە هەڵدەبژێرین، قونووتی بەیانیان بە سوننەت دەزانین و داکۆکی لەسەر ئەو حاڵەتە دەکەین کە ئێستا لەدوای روکووعی رکاتی دووەمی نوێژی بەیانیاندا دوعای قونووت دەخوێنین، کە ئەگەر نوێژکەرێک نەیکرد سەجدەی سەهوی لە بریتیدا بۆ دەبات -هەر خوداش چاکتر دەزانێ چۆنە.

بە واجیبی سەر شانیشی دەزانم لەدوای ئەم هەڵبژاردنە هەستی خۆم دەربڕم بەرامبەر بە رێزو حورمەتی زۆرم بۆ ئەو زاتانەی خاوەنی بیروڕای دووەمن و لە خودام داوایە پاداشتی هەوڵی ئەوان و هەڵی چاکەی هەموو لایەک بداتەوە کە هەردوو لا خاوەنی بیرو بروای بێ گەردی تایبەتین بۆ خودا، خاوەنی بیرو بروایەکن خالی لە هەموو هەست و نەستی دیکەی بێجگە لە دین پەروەریی، خودا رێزو پایەیان زێتر بکات و پاداشتیان پتر بداتەوە، خودا لەبەر خاتری ئەوان لە ئێمەو دایک و باو ک و مامۆستای ئێمە خۆش بێ‌و لە رۆژی حەشردا لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکاتەوە.

# دوعای قونووت

قونووت بەهەر وشەیەکی دوعا بێت یا بەهەر وشەیە مەتحی زاتی خودای تیا بێ دروستە بەڵام چاکتر وایە مأثور بێ وەکو ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویست قونووتی پێ کردووە کە لە خوارەوە دەینووسین کە سوننەتە لە کۆتاییدا سەڵاواتی سەر پێغەمبەریشی تیا بێ. دوعایەکەش ئەمەیە:

((اللهم اهدني فيمنْ هديت، وعافني فيمَنْ عافيت، وتولّني فيمنْ توليت، وبارك لي فيما أعطيت وقني شرّ ما قضيت فإنّك تقضي ولا يُقضى عليك، وإنّه لا يذلّ من واليت ولا يعزّ ما عاديت، تباركت ربنا وتعاليت[٢٤]، فلك الحمد على ما قضيت، استغفرك وأتوب اليك)) وصلى الله على سيدنا محمد النبي الأمّيّ وعلى آله وصحبه وسلّم.

---

[٢٤] التاج ج١.

بە زیادەکەیەوە اعانة ج١.

بێ گومان ئەگەر پێشنوێژ بیخوێنێ لە جیاتی راناوی کەسی یەکەمی تاک؛ راناوی کەسی یەکەمی کۆ بەکار دەهێنێ.

هەروەها سوننەتە ئەم دوعایەی خوارەوەی ئیمامی عومەر خوای لێ رازی بێ بخوێندرێ کە (البیهقی) ریوایەتی کردووە ئەمەش دوعاکەیە[٢٥]:

((اللهم إنا نستعينك ونستغفرك ونؤمن بك ونتوكل عليك ونثني عليك الخير كله، نشكرك ولا نكفرك ونخلع ونترك من يفجرك. اللهم إياك نعبد ولك نصلي ونسجد واليك نسعى ونحفد، نرجو رحمتك ونخشى عذابك إنّ عذابك الجد بالكفار ملحِقٌ)) ئینجا سەلاوات لە پێغەمبەر بدرێ.

جا ئەم دوعایە ئەگەر یەکێکیان بخوێندرێ ئەوا یەکەم خوێندنی چاکترە. بەلام ئەگەر نوێژکەر بەتەنیا بوو، یا پێش نوێژی چەند نوێژکەرێکی دیار بوو ئەوا خوێندنی هەردوو دوعا بەیەکەوە چاکترەو، ان شاءا لله پاداشتێکی زۆری هەیە.

---

[٢٥] اعانة ج١.

# قونووتی كارەساتان و
# قونووتی نوێژی (وتر)

سەرەڕای ئەوەی لە پێشەكی ئەم نامیلكەیەدا ئاماژەمان بۆ ئەوە كرد كە دەڵێین لەبەر ئەوەی بابەتەكەی ئێمە سەبارەت بە قونووتە، قونووتیش بێجگە لە نوێژی بەیانیان لە وەختی دیكەش دەخوێندرێ وەكو ئەوەی ئەگەر كارەساتێك دابەزێتە سەر كۆمەڵگایەك لە نوێژەكاندا قونووت دەكرێت و بێجگە لەمەش لە نوێژی (وتر)دا. جا ئێمە بەكورتی باسی هەر یەكەم دوانە دەكەین.

# قونووتی وەختی کارەسات

## ( قنوت النازلة )

مەبەست لە قونووتی کارەساتاندا ئەوەیە وەختێ، خودا کارەساتێک بۆ سەر کۆمەڵێک لە کۆمەڵگای موسڵمانان (نازل) بکات ئەوا لە نوێژدا قونووت کردن مەشروعەو دوعاو پاڕانەوە لەبەر خودا دەکرێ تا ئەو کارەساتە هەڵبگرێت و بارگرانیان لەسەر لا ببات یا لە قونووتدا دوعا لە چینێکی تاوانبار دەکرێت.

جا سەبارەت بەم ئەرزە قونووتە ئەوا دیسان زانایان بوونەتە دوو بیرو ڕاو دوو تاقم؛ تاقمێکیان کە کەمەکەیانن لەسەر ئەو باوەڕەن کە چ کارەساتێک قونووتی بۆ ناخوێندرێ بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەندێ بەسەرهاتی زەحمەت و لەبەر دڵ گرانی بەسەردا هاتووە، شتێکی ئەوتۆی لێ نەبیستراوە بێتە نیشانەی ئەوەی لە نوێژدا قونووتی بۆ خوێندبێ، لەوانە

وەکو ئەو گەمارۆدانەی لەشەری (خەندەق)دا لەسەر موسڵمانان کراو هەڵ دیکەمش. بەڵام هەندێ زانای دیکە -کە ئەوانە زۆرن- لەسەر ئەو باوەڕەن پێغەمبەرﷺ قونووتی بۆ کارەساتان خوێندوە وەڵامی ئەوانەش کە دەڵێن پێغەمبەرﷺ قونووتی نەخوێندووە؛ بەوە دەدەنەوە کە پێغەمبەرﷺ لەو هەندانە نەیخوێندووە بەڵام لە هەندێکی دیکەدا واتا لە هەندێ کارەساتی دیکەی خوێندو، بەڵگەشیان بۆ ئەمە لەنێو فەرموودەکانی پێغەمبەردا زۆرە، ئێمە ئەم بەڵگانەی خوارەوە ناوزەد دەکەین:

- ((عن أبي هريرةﷺ قال قَنتَ رسول اللهﷺ في صلاة العتمة شهراً يقول في قنوته: اللهم نَجِّ الوليد بن الوليد اللهم نجِّ سلمة بن هشام اللهم نجِّ المستضعفين من المؤمنين اللهم اشددْ وطأتك على مُضَر اللهم اجعلها عليهم سنين كسني يوسف. قال أبو هريرة واصبح رسول اللهﷺ ذات يومٍ فلم يدع لهم، وذكرت ذلك لهم وقال وما تراهم قد

قدموا))[٢٦].

(أبو هريرة) خوداى لىَ رازى بىَ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرﷺ يەكَ مانگَ لە نوێژى عيشاياندا قونوتى دەكردو ئەم دوعايەى دەگوت: خودايە (الوليد كوڕى الوليد) ڕزگار بكە، خودايە (سلمە كوڕى هشام) ڕزگار بكە خودايە چەوساوە بڕوادارەكان ڕزگار بكە، خودايە عەزابى خۆت بخەرە سەر (مُضَر) خودايە گرانى وەكو گرانى زەمانى (يوسف)يان بەسەردا بهێنە. (أبو هريرة) دەفەرموێ بەيانيەكيان پێغەمبەرﷺ دوعاى بۆ نەكردن منيش پێم گوت فەرمووى نابينى هاتنەوە.

هەر لەم بارەيەوە فەرموودەى ديش هەيە وەكو ئەم دوو فەرموودەيە:

– وفي رواية لأنس قنت رسول الله ﷺ بعد الركوع شهراً يدعو على قاتلي القراء[٢٧].

---

[٢٦] سنن أبي داود ج١.

[٢٧] ارشاد الساري لشرح صحيح البخاري ج٢.

واتا (أنس) ريوايەت دەكا دەڵێ پێغەمبەری خودا ﷺ مانگێک لەدوای روکوعد قونووتی دەکردو دوعای لە بکوژانی قورئان خوێنەکان دەکرد.

نموانە ئەو حەفتا قورئان خوێنە بوون پێغەمبەر ناردبوونیە نێو چەند هۆزێکی خودا نەناس تا بانگهێشتی پەسەند کردنی پەیامی ئیسلامەتیان بکەن و قورئانیان بۆ بخوێنن، هۆزەکانیش (رعل)و (ذكوان)و (عصيه) بوون، لەسەر بیری (معونة) دەستیان لێ وەشاندبوون و شەهیدیان کردبوون تەنیا (كعب كوری زيد الأنصاري)يان لێ دەرباز بووبوو.

– عن ابن عباس قال قنتَ رسول الله ﷺ شهراً متابعاً في الظهر والعصر والمغرب والعشاء والصبح في دُبر كل صلاةٍ اذا قال سمع الله لمن حمده في الركعة الآخرة يدعو على أحياء من بني سليم على رعل و ذكوان و عصيه ويؤمن من خلفه. رواه أبو داود[٢٨].

[٢٨] جامع الترمذي مع شرحه تحفة الأحوذي ج١.

واتا ابن عباس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ مانگێک لەدوای یەک لە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشاو نوێژی بەیانی لەدوای هەموو نوێژێک هەر کە لە رکاتی دوایی گوتی سمع الله لمن حمده ئەوا دوعای لە هەندێ هۆزی (بنی سلیم)دەکرد لە (رعل)و (ذکوان)و (عصیە)، نوێژکەریش لەدوای ئەودا دەیانگوت آمین.

جا ئەمانە بەڵگەی بوونی قونووتن و بەڵگەی ئەوەن کە دوعا کردن لە گاوڕو تاوانباران نوێژی پێ نابڕێ.

لەوانەی دەڵێن قونووتی کارەساتان مەشروعە: ئیمامی (شافعی)و (احمد کوڕی حنبل)و هی دیکەش.

سەبارەت بە مەسەلەی دروست بوونی قونووتیش لە چ وەختێکی ناو نوێژدا ئەوا ئەویش جیاوازی لەسەرە، هەندێ دەڵێن لەپێش روکوعە، بۆ ئەوەی وەخت زیاتر بە بەرەوە بهێنی‌و نوێژکەری دیکە بە رکاتەکە ڕا بگەن بەڵام هەندێکی دی دەڵێن دوای روکوعە وەختی گوتنی سمع الله لمن حمده بەڵگەی بیروڕای یەکەم چەند فەرموودەیەکە لەوانە ئەم فەرموودەیە:

- حدثنا مسعود قال حدثنا عبدالواحد قال حدثنا عاصم قال سألت أنس بن مالكﷺ عن القنوت فقال قد كان القنوت -أي مشروعاً- فقلت قبل الركوع أو بعده قال قبله، قلت إنّ فلاناً أخبرني عنك أنّك قلت بعد الركوع فقال كذب انما قَنتَ رسول اللهﷺ بعد الركوع شهراً[29].

(عاصم) خوداى لێ رازى بێ گوتوویه: له (أنس كورِى مالك)م سه‌بارەت به قونووت پرسى فه‌رمووى قونووت مه‌شروعه، گوتم له‌پێش روكووع يا له‌دواى روكووع فه‌رمووى له‌پێش روكووع، گوتم فيلانه كه‌س له تۆوه‌ى بۆ گێرامه‌وه كه گوتووته دواى روكووعه فه‌رمووى درۆيه، پێغه‌مبه‌رى خوداﷺ يه‌ك مانگ له‌دواى روكووعدا قونووتى كردووه.

به‌لام به‌لگه‌ى ئه‌وانه‌ى ده‌لێن دواى روكووعه زۆرتره له به‌لگه‌ى ئه‌وانه‌ى ده‌لێن پێش روكووعه، له‌وانه ئه‌م دوو فه‌رمووده‌يه هه‌لده‌بژێرين:

---

[29] ارشاد الساري لشرح صحيح البخاري ج٢.

– من رواية لأنس ﷺ: قنتَ رسول الله ﷺ بعد الركوع شهراً يدعو على قاتلي القراء[30].

له (أنس) دەگێرنەوە فەرموویە پێغەمبەر یەک مانگ لەدوای روکووع قونووتی کردومو دوعای لە بکوژانی قورئان خوێنەکان کردووە.

– وفي رواية عن ابن عباس ﷺ قنت النبي ﷺ شهراً متابعاً في الصلوات كلها في اعتدالِ الركعة الأخيرة يدعو على احياءِ العرب ويؤمن خلفه[31].

واتا (ابن عباس) خودایان لێ رازی بێ ریوایەت دەکاو دەفەرموێ پێغەمبەر مانگێک لەدوای یەک لە هەمووی نوێژاندا لە هەڵستانەوەی روکووعی رکاتی دوایی قونووتی دەکردو دوعای لە هەندێ هۆزی عەرەب دەکرد، نوێژکەرەکانیش دەیانگوت آمین.

---

[30] التاج ج١.

[31] ریوایەتی أبو داود.

ئەوانەی دەڵێن پێش ڕوکووع دەکرێ ئیمامی (أبو حنيفة)و (سفيان الثوري)و هەندێکی دیکەن، بەڵام ئەوانەی دەڵێن دوای ڕوکووع دەکرێ ئەوا ئیمامی (شافعي)و ئیمامی (أحمد)و هەندێ یاوەرو تابیعی دیکەن.

هەر لەم بابەتەوە مەسەلەیەکی دیکەش هەیە ئەویش ئەوەیە ئایا لە هەموو نوێژەکاندا دەکرێ یا لە چەند نوێژێکدا؟ ئەویش جیاوازی لەنێو زانایانی لەمەڕدا هەیە، هەیانە دەڵێن لە چەند نوێژێک دایە، هەشیانە دەڵێن لە هەمو نوێژەکاندا دەکرێت، بەڵگەش ئەم فەرموودانەی خوارەوەن:

– عن أبي هريرﷺ أن رسول اللهﷺ كان يقول في صلاة الفجر بعدَ ربَّنا لك الحمد في الركعة الآخرة اللهم أنج الوليد بن الوليد وسلمة بن هشام وعياش بن ابي ربيعة والمستضعفين من المؤمنين اللهم اشدُدْ وطأتك على مضر واجعلها عليهم كسني يوسف اللهم العنْ لحيان ورعلا وذكوان وعصيه عصتِ الله ورسوله. ثم ترك ذلك حين نزل ﴿وليس

لك من الأمر شيء﴾ رواه الثلاثة[٣٢].

واتا (أبو هريرة) خوّدای لیّ رازی بیّ دەیگێرِێتەوە دەڵێ پێغەمبەرﷺ لەدوای نوێژی بەیانیدا دوعای دەکردو دەیگوت خودایە (الولید کوڕی الولید)و (سلمة کوڕی هشام)و (عیاش کوڕی ابي ربیعة)و چەوساوە بڕواداره‌كان ڕزگار بكه. خودایه گرانی عه‌زابی خۆت بخەرە سەر (مضر)و لێیان بکە گرانی (یوسف)، خودایە نەفرەت لە (لحیان)و (رعل)و (ذكوان)و (عصیه) بكه له خوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوونه. (أبو هریرة) دەڵێ پاشان كه ئایەتی ﴿ولیس لك من الأمر شيء﴾ هاتە خوارەوە وازی لیّ هێنا.

– عن ابي هريرة انه قال: قنت رسول اللهﷺ في صلاة العتمة شهراً يقول في قنوته ((اللهم انج الوليد بن الوليد..... الخ))[٣٣].

---

[٣٢] التاج ج١.

[٣٣] سنن أبي داود ج١.

(أبو هريرة) دەڵێ پێغەمبەرﷺ مانگێک لە نوێژی عیشادا قونووتی دەکرد ئەم دوعایەی دەکرد کە لەپێشتر نووسیمان.

– حدثنا داود بن أمية حدثنا معاذ يعني ابن هشام حدثني أبي عن يحيى بن ابن كثير حدثني ابو سلمة ابن عبدالرحمن حدثنا أبو هريرة قال وا لله لأقَرِّبَنَّ بكم صلاة رسول ا للهﷺ قال فكان أبو هريرة يقنت في الركعة الآخرة في صلاة الظهر وصلاة العشاء الآخرة وصلاة الصبح ويدعو للمؤمنين ويلعن الكفار[٣٤].

لە (أبو هريرة) دەگێڕنەوە فەرموویە لە هەمووتان زیاتر لە نوێژی پێغەمبەرەوە نزیکم. دەگێڕنەوە (أبو هريرة) لە رکاتی دوایی نوێژی نیوەڕۆو عیشاو نوێژی بەیانی قونووتی دەکردو دوعای بۆ ئیمانداران دەکردو نەفرەتی لە کافران دەکرد.

– حدثنا عبدا لله بن معاوية حدثنا ثابت بن زيد عن

---

[٣٤] صحيح مسلم ج٤.

هلال بن خباب عن عكرمة عن ابن عباس قال قنت رسول الله ﷺ شهراً متابعاً في الظهر والعصر والمغرب والعشاء وصلاة الصبح في دبر كل صلاة[٣٥].

واتا له پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە یەک مانگ لەدوای یەک لەدوا دوایی هەموو نوێژێکی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشاو بەیانی قونووتی کردووە.

– في رواية أخرى عن ابن عباس (رضي الله عنهما): قنت النبي ﷺ شهراً متابعاً في الصلوات كلها في اعتدال الركعة الأخيرة يدعو على أحياء من العرب ويؤمن خلفه[٣٦].

واته (ابن عباس) خودایان لێ رازی بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ مانگێک لەدوای یەک لە هەڵستانەوەی رکاتی دوایی هەموو نوێژەکان قونووتی کردووەو دوعای لە هەندێ هۆزی عەرەبان کردووە لە دوایدا دەگوترا آمین. کە ئەم

---

[٣٥] سنن أبي داود مع حاشية عون المعبود ج١.

[٣٦] ریوایەتی أبو داود.

فەرموودەیەش بۆ بەڵگەی دوای روکووع پێشتر باسمان کرد.

پوختەی قسە: وا دەردەکەوێ کە قونووت خوێندن لە وەختی کارەساتاندا مەشروعەو لە هەموو نوێژێکیشدا دەکرێت و لەدوای روکووعیشدایە.

# قونووت لە نوێژی (وتر)دا

بەر لەوەی باسی قونووتی نێو نوێژی (وتر) بکەین پێویستە کەمێک لەسەر (وتر) خۆی بدوێین:

وشەی (وتر) واتا تاک، مەبەستیش لێرە لەو نوێژەیە ژمارەی رکاتەکانی تاک بێ وەکو بڵێین یەک، سێ، پێنج.... تاد.

لە چۆنیەتی نوێژی (وتر) جیاوازی نێو زانایانی لەسەردا هەیە. ئیمامی (شافعی)و (مالک)و (احمد کوری حنبل) دەڵێن سنەتە واجیبە، بێ گومان لەلای حەنەفیەکانیش واجیب لە خوار فەرزەوەیە.

جیاوازی پێشەوایانی شەرع لەسەر نوێژی (وتر) بەم جۆرەیە:

- ئیمامی (حنفی) دەڵێ سێ رکاتە، بەیەک سەلام دانەوە واتا هەرسێ رکات پێکەوە بکرێت. وەختەکەشی لەدوای ئاوابوونی شەفەقە تا ئەو وەختەی بەیانی هەڵدێت.

- ئیمامی (احمد) دەفەرموێ کەمەکەی نوێژی (وتر) یەک رکاتەو زۆرەکەی یازدە رکاتە. ئەگەر نوێژکەر یازدە رکاتەکەی کرد باشتر وایە دوو رکات دوو رکات بیکات ئەوەی دوایی تاق بێ. بۆ وەختەکەشی بە بیروڕای ئیمام (احمد) باشتر وایە لەدوا دوایی شەودا بکرێت، دروستە بەر لە خەوتنەوەی بکرێت.

- ئیمام (مالک) دەفەرموێ یەک رکاتە، دوو کاتی هەیە.

- ئیمام (شافعی) دەفەرموێ لای کەمی نوێژی (وتر) یەک رکاتەو، زۆرەکەی یازدە رکاتە. کاتەکەی لەدوای نوێژی عیشاوەیە تا بەیانی داهاتنە. باشتر وایە درەنگی شەو بێ، لە مانگی رەمەزانیشدا جەماعەتی تێدا سونەتە.

# قونووت لە (وتر)دا

دەربارەی خوێندنی قونووت لە نوێژی (وتر)دا دیـــان دوو ڕای جیاواز هەیە؛ بیروا ڕایەکیان لەسەر ئەوەیە کە قونـووت لـە نوێژی (وتر)دا لە هـەموو وەختێکی ساڵدا دەکرێت و لەپێش ڕوکووعدایە.

بیرو ڕایەکی دیکەش هەیە دەڵێ قونووت تەنها لـەنیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزاندا دەکرێت و لەدوای ڕوکووعە.

ئەوانـەی لایـــەنگری بـیروڕای یەکـەمن ئـەوا (سـفیان الثوری)و (ابن المبـارک)و (اسحاق)و ئیـمامی (ابـو حنیفـە)و خەڵکی کوفەن بۆ دروستی ڕایەکەشـیان بەڵگـە لـەم فەرموودەیـە دەخوازن کـە لـە (ابـی کـوڕی کعـب) دەگێڕنـەوە فەرموویـە پێغەمبەرﷺ نوێژی (وتر)ی دەکردو لەپێش ڕوکووعدا قونووتـی دەخوێند.

ئیـمامی (علی)و ئیـمامی (شافعی)و ئیـمام (احمـد)و

خەلیفەکانی دیکەی راشیدین و (ابن عمر)و بێجگە لەوانیش دەڵێن قونووتی لە (وتر)دا نیە تەنیا لە نیوەی دووەمی مانگی رەمەزاندا نەبێ، واتا لە شەوی شازدەمینەوەرا قونوت لە (وتر)دا لەدوای روکووعەوە دەستی تێدا بەرز دەکرێتەوە وە چونکە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ وای کردووە.

پوختەی ئەمەش لەوەدایە کە ئەو بیروڕایەی دەڵێ قونووت لە نوێژی (وتر)دا تەنها لە نیوەی دووەمی مانگی رەمەزاندا دەبێ و لەدوای روکووعیشدایە ئەوا پێ دەچێ بەهێزتر بێ.

# دوا وته

ئەمە ئەو چەند لاپەڕەیە بەڕەحم و هیممەتی خودا، بوو بە بەرهەمی موتەوازیعی هەولێکی موتەوازیع لەپێناوی خزمەتی کارێکی پیرۆز بۆ سوودی ئەوانەی سوودی لێ دەخوازن و بۆ کارپێکردن لە لایەن موسڵمانانەوە.

لە خودام داوایە ئەو هەوڵەمان لێ پەسەند بکات کە تەنیا بۆ ڕەزامەندی خودایەو بە ئومێدی ڕەحمەتی خودایە بە بەر لێخۆشبوونی گوناهانی بخات.

وآخر دعوانا إن الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين.

٢٠/ذي الحجة/١٤١٦ك

٩/مايس/١٩٩٦ز

هەولێر / گەڕەکی عەداله

مزگەوتی (الفرقان)

**تێبینی:**

پەراوێزەکان لە زۆر سەرچاوەدا هاتوون بەڵام ئێمە بۆ دڵنیایی و تەئکید بۆ هەر یەکە یەک سەرچاوەمان نووسیوە.

**سەرچاوەکان:**

١- قورئانی پیرۆزو چەند تەفسیرێک.

٢- التاج الجامع للاصول في أحاديث الرسول. تاليف الشيخ منصور علي ناصيف ط٤.

٣- ارشاد الساري لشرح صحيح البخاري. تأليف ابن لعباس شهاب الدين القسطلاني.

٤- جامع الترمذي مع شرحه تحفة الأحوذي.

٥- سنن أبي داود مع حاشية عون المعبود.

٦- صحيح مسلم بشرح النووي.

٧- المجموع شرح المهذب.

للإمام أبي زكريا محي الدين بن شرف النووي.

٨- حاشية اعانة الطالبين للسيد أبي بكر المشهور بالسيد البكري على حل الفاظ فتح المعين.

٩- لسان العرب المحيط للعلامة ابن منظور.

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری / هەولێر